# ئۆڤیانووسێک لە تاوان

---

نووسین و شیکردنەوەی : خەندان محەمەد جەزا

( ئۆڤیانوسێک لەتاوان ) ناونیشانی ئەو توێژینەوەیەیە کە لەلایەن بەڕێز ( خەندان محەمەد جەزا سەرپاچ ) ەوە نووسراوە و شیکراوەتەوە . لەلایەن تیمی پرۆژەی (هاوکاری گرتووخانەی ژنان لە سلێمانی ) ئەنجامدراوە . بەڕێوەبەری توێژینەوەکەش بەڕێز (جەمال وەلی ئیبراهیم) و سەرپەرشتی زانستیش لەلایەن بەڕێز (سۆران عەبدولقادر کۆستە ) کراوە و ڕێکخراوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خانزاد بەهاوکاری ڕێکخراوی هاوکاری جیهانی_ ئەڵمانی پێی هەستاون . ئەم توێژینەوەیە توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەروونیە سەبارەت بە دیاردەی لەشفرۆشی و بازرگانی بە جەستەی ڕەگەزی مێینەوە لەکۆمەڵگای کوردستاندا .
ماڵپەڕی دەروونناسی دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی لە نووسەری لێکۆڵینەوەکە بەزنجیرە چەند بەشێکی ئەم توێژینەوەیە پێشکەش بە خوێنەرانی دەروونناسی دەکات .

---

بەشی یەکەم

## سەرهەڵدانی لەشفرۆشی لەمێژوودا

کاتێک باس لە لەشفرۆشی دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی دەوترێت کە یەکێکە لەکۆنترین پیشەکان کە مرۆڤایەتی زانیویەتی و تەنانەت هەندێک بیرو بۆچونی جیاواز هەیە سەبارەت بەسەرهەڵدانی لەشفرۆشی ، بەپێی هەریەک لەوبیرو بۆچونانە بنەڕەت و دێرینی ئەم کارە وەک پیشەیەک لێک دەدەنەوە ،بەنمونە هەندێک سەرەتاکانی دەگەڕێننەوە بۆ پەیدابونی ڕاوو شکار، واتە کاتێک مرۆڤ ڕاوی کردووە بەرامبەر ڕاوەکە یان نێچیرەکە هەستاوە بە ئاڵوگۆڕ لەپێناوی سێکسدا ، هەندێکی دیکە دەڵێت لەگەڵ سەرهەڵدانی دراودا پەیدا بوە ، هەندێکی تر دەڵێت سەرهەڵدانی لەشفرۆشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتە وەختەی کە بازرگاندروست بوە..بەم جۆرەش هەریەک لەو بیرو بۆ چوونانە دەخوازن بەشێوەیەک لەشێوەکان بڵێن لەشفرۆشی یەکێکە لەهەرە کۆنترین جۆرەکانی پیشە کەمرۆڤایەتی پەیرەوی کردوە بۆ دابینی بژێوی خۆی .
وەک مێژووزۆرێک لەمێژوو نووسان و شارەزایانی بواری کەلتورو شارستانیەتیەکان ئەم پیشەیە دەگەڕێننەوە بۆ 3000 ساڵ پ .ز .* بەڵام زۆر ئاستەنگە کەسەرهەڵدانی لەشفرۆشی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا دیاری بکەین و بڵێین لەبەروارێکی دیاری کراودا سەریهەڵدا ،چوونکە ئەو پرۆژەیە بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئەرکێکی زۆرگرانە لەڕووی مێژوو نوسینەوە ، کەئەمەش بۆ زۆربەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان ڕاستە .
ئەوەی مرۆڤ لەئاژەڵەکانی تری جیادەکاتەوە بریتیە لەئاستی گەشەکردنی کۆئەندامی دەمار کەبەهۆی ئەم گەشەیەوە بەشێکی گەورە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی مرۆڤیش گۆڕاوە کەیەکێک لەوانە بریتیە لە توانای قسەکردن و بەهۆی ئەمەشەوە توانیویەتی بنەمای ئەخلاقی بهێنێتە گۆڕێ، کەلەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر جیاواز بوە . گەر ئەم مەسەلانە هەموویان وەلا بنێین و پرسیار لەخۆمان بکەین تابزانین سەرەتاکانی بە مرۆ بوونی مرۆڤ لە گیانەوەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەی .. ئەوا ئەو کات دەتوانین بڵێین ئەوە سەرتایەکە بۆ دروست بونی هەندێک لە بنەمای ئەخلاقی کەدواجار دەتوانین گفتوگۆ لەسەر مەسەلەی سەرەتاکانی لەشفرۆشیش بکەین .

لێرەدا ئێمە مەبەستمان نییە لەچوارچێوەی ئەم توێژینەوەیەدا باس لەمەسەلە مێژوویەکانی ئەنترۆپۆلیژیاو دروست بوونی مرۆڤ بکەین ،یان بمانەوێت یەکێک لەمەسەلە ئەنتولۆجیەفەلسەفیەکانی بوون بسەلمێنین ،بەڵام دەڵێین بێگومان مرۆڤ لەقۆناغێک لەقۆناغەکانی ژیانیدا ،هەروەک ئاژەڵ مامەڵەی لەگەڵ سێکسدا کردووە بەتەنیا پشتی بەستوە بەهاندەرە

غەریزیەکان بۆ ئەوەی سێکس بکات و تاکە وەزیفەی سەرەکی سێکشیش بریتی بووە لە زۆربوون .. بەڵام پاش گەشەی مرۆڤ و پەرەسەندنی کۆئەندامی دەمارو بەهێزبونی توانای بیرکردنەوەو بیرکەوتنەوە ، واتە ( التفکیر والتزکر ) سێکس لای مرۆڤ فەنتازیای تیادا دروست دەبێت . واتە دەتوانین بڵێین کەلە زۆر کۆندا مرۆڤیش وەک هەر ئاژەڵێکی تر سێکسی کردووە و پاشان پەرەی سەندوە تا بوەتە شێوازی جۆر بەجۆر لەپەراوەی سێکسدا .. لەڕاستیدا بۆ ساغکردنەوەی ئەم ڕاستیانە پێویستە پشت بە هەندێ بەڵگە نامەی مێژووی و ئەنتیکناسی ببەستین ، بەڵام ئەمەش لەم توێژینەوەیەی ئێمەدا کارێکی گرانەو نامانەوێت خۆی لێ نزیک بکەینەوە ، دڵنیاین کەمێژوویەکی دیاریکراوی هەیە بەپێی سروشتی پەرەسەندنی شارستانیەت و کەلتورەکانی مرۆڤایەتی ، بەڵام لە ڕوی مێژوو نوسیەوە ناتوانین ڕۆژێک یان مێژوویەک یان سەدەیەکی دیاریکراو دەستنیشان بکەین سەبارەت بەو مەسەلەیە.*
ئێستاش بۆ ئەوەی سەرتاو سەر هەڵدانی لەشفرۆشی باس بکەین وەک بنەمایەکی تیۆری پێویستمان بەپێناسەیەک هەیە بۆ ئەم دیاردەیە . کەبەپێی ئینسایکلۆپیدیای (ویکیپێدیا) بریتیە لە : " فرۆشتنی خزمەت گوزاری سێکسی بەرامبەر بە پارە یان هەر جۆرە دەستکەوتێکی تر " . بەڵام بە پێی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد کە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ پیشەی لەشفرۆشی و لە بکەرەکەیەوە پێناسەی دەکات و دەڵێت : " لەشفرۆش ئەو ژنە و/ یان پیاوەیە کە خۆی دەخاتە خزمەتێکی سێکسیەوە بۆ یەکێکی تر بەرامبەر بڕێک لە پارە " .

بەپێی ئەم زاراوەو چەمکانەش سەرهەڵدانی لەشفرۆشی پێویستی بە هەل و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە ، کە لێەدا دەبێت خاڵبەندیان بکەین و دەڵێن لەشفرۆشی لەگەڵ گەشەسەندن و دروست بوونی هەریەک لە خاڵانەدا گەشەی کردووە تا گەیشتۆتە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی گشتی دەرهاویشتەی ساتەوەختێکی مێژوویی نی یە . گرنگترین ئەو هۆکارانەش ئەمانەی لای خوارەوەن :
1- نەگەیشتنی مرۆڤایەتی بەکۆمەڵگایەک کەتیایدا مرۆڤ سەردارو سالار بێت نەک یەکێک لەڕەگەزەکان خاوەن سەروەری بێت : چونکە لەیەکێک لەبارەکانی تردا ، واتە گەر ۆمەڵگا پیاو سالار بێت یان ژن سالار ئەوا دەرفەت هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەڕووی سێکسەوە ببێتە کاڵا ، بەواتایەکی تر سەرەتاکانی لەشفرۆشی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای یەک ڕەگەز سالاری جا ئەگەر ئەو باری سالاریە ژن بوبێت یان پیاو.
2- لە ڕێگای پێناسەکانەوە دەتوانین بڵێین : کەڵەکەبوون و دەگمەنی ، (التراکم والندرە) ی سێکس یەکێکی ترە لە هەلومەرجە پێویستیەکانی سەرهەڵدانی لەشفرۆشی : واتە پێویستە یەکێک لەڕەگەزەکان پێویستیەکی بۆ دروست ببێت بە مومارەسەکردنی سێکس و بەڵام بە ئاسانی بۆی دەستەبەر نەبێت ، پاشان لەلای دووەمیشەوە ئەم مەسەلەیە فرە بێت واتا تونایەکی بەرفراوانی لە پەراوەی سێکس هەبێت و لێی زیاد بێت بەواتای پێویستی ناڵێین ، بەڵکو بەواتا شمەکیەکەی، (المعنی السلعی للجنس ) ، بەم پێیەش لەشفرۆشی دروست دەبێت ، بەڵام مەرجدارە بەیاساکەوە کە قەدەغەی بکات یان تابوی بکات ، بۆ ئەوەی ئەو کاڵایە کڕین و فرۆشتنی تێدا دروست ببێت .
3- پێویستە بازرگانی هەبوبێت ، واتە سەرچاوەی بەرهەمهێنان هەبوبێت و لەونێوەندەشدا بازاڕ هەبووبێت ، کە یەکێکیش لەمەرجەکانی بازاڕ بریتیە لە هەبوونی هۆکاری ئاڵوگۆڕ : لەبەر ئەوەش لەشفرۆشی بەپێی پێناسەکان بەپێی سروشتی خۆی بریتیە لەپرۆسەی ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی لەنێوان خزمەتگوزاری سێکسی و پارەدا ئەوا کاتێک سەریهەڵداوە کەبازاڕ هەبووبێت ، لە پێش مەرجەکانی بازاڕیش بەدەر لەبەرهەمهێن و ،بەکارهێن هەبوونی کاڵای ناوەندی یان پارەیە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئاڵوگۆڕی ئەو خزمەتگوزاریە ڕوودات ، جا کاڵای ناوەندی بریتی بووبێت لەشمەکێک یان دراوێک ، یان خزمەتگوزاریەکی دەگمەن.*
4- مرۆڤ توانای پەراوەی سیچکسی هەبووبێت بەشێوەیەکی تەجریدی و بەتەنیا سێکسێکی موجەڕەدی کردبێت : سێکس پرۆسەیەکی موجەڕەد نیە لەهەست وسۆزو خۆشەویستی و پەیوەنیەکی زیندەگانیانەی پڕ واتا ، کە لەلای گیاندار بەشێوەیەکی غەریزی گوزەر دەکات ، لەلای مرۆڤیش لەسەردەمی کۆمۆنەیی سێکسدا هەمان سروشتی هەبوە ، بەڵام بەهۆی گەشەی کۆئەندامی دەمارەوە و پەرەسەندنی بیرکردنەوەو بیرکەوتنەوەوە ، مرۆڤ ئارەزوی تاقیکردنەوە دەکات و هەندێک جار کردەکان دەبنە خویەکی موجەڕەد ، ئەگەرچی هەمان ئالیەتی بارە ناتەجریدیەکەیان هەیە ، ئالەم بارەدا کاتێک سێکس دەبێتە خزمەتگوزاریەکی پێشکەشکراو بەرامبەر بەپارە یان هەر شمەکێکی تر ئەوا دەتوانین بڵێین کەپەراوەی سێکسی تەجرید بوە.
5- قۆناغێکی کۆمەڵایەتی ئینتیقالی بۆ سێکس هەبوە کەلەنێوان کۆمۆنەیی و خاوەندارێتیدا سێکس بکاتە کاڵا بەدەر لەتوانای خاوەندارێتی هەریەک لەڕەگەزەکان :واتە دەگەڕێینەوە سەر قۆناغی کۆمۆنەی سێکسی*، ئەوا دەڵێین لەم قۆناغەدا سێکس لەبارێکی ڕەهای هەمەجۆری سێکسدا بوە (التنوع الجنسی) ، وردە وردە لەگەڵ سەرهەڵدانی خاوەنداری سێکسیدا و بۆ گەرانەوە بۆ ئەو بارودۆخی هەمەجۆریە و چێژەکانی هەمەجۆری ، دەرفەتێکی باش بوە بۆ سەرهەڵدانی لەشفرۆشی و تەنانەت دەرفەتێکی باش بوە بۆ هێنانە کایەی فرە ژنی و فرە پیاوی .

6- سروشتی سێکچواڵیتی هەریەک لەژن و پیاو دوو هۆکاری یلریدەدەر بوون بۆ سەرهەڵدانی لەشفرۆشی : لەبەرئەوەی بڕگەیەکی تایبەتمان لەباسکردن هەیە سەبارەت بەم خاڵە لێرەدا ناچینە وردەکاریەکانیەوە .
7- پرۆسەی هاوسەر گیری سەرئەنجامی خاوەندارێتی و سەرئەنجامی گەشەسەندنی ئابوری کۆمەڵگاکان هاتۆتە گۆڕێ ،

هەر بۆیە دەڵێین مێژووی سەرهەڵدانی هاوسەرگیری بنەمایەکی ئابوری هەیەو ئەمەش یەکێکی ترە لەمەرجەکانی سەرهەڵدانی لەشفرۆشی . واتە سەرەتاکانی لەشفرۆشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتانەی کەهاوسەرگیری پەیدابوە .
8- خودی هاوسەر گیری لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا هاندەرە بۆ سەرهەڵدانی لەشفرۆشی * :لەبەشێکی زۆری کۆمەڵگاکاندا بەتایبەت کۆمەڵگا دواکەوتوەکان ، پرۆسەی هاوسەرگیری سەرئەنجامی ئاڵوگۆڕی ژن بەرامبەر بەدراو ڕوودەدات ،کەئەمە یەکێک بوە لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی لەشفرۆشی لەمێژووداو کاتێک هاوسەرگیری لەسەر بنەمای ئەم ئاڵوگۆڕ ئەنجامدرا ، ئەوا هەر خۆیشی جۆرێکە لەجۆرە ڕێکخراوەکانی .

بەم جۆرەش ئەم خاڵانە بنەمای سەرەکین بۆ سەرهەڵدانی لەشفرۆشی ، هەرچەند ناتوانین دەستنیشانی بکەین ، کەبرواری سەرهەڵدانەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەی و مەرجیش نیە کەسەرەتاکانی لەشفرۆشی لەگەڵ ئامادە باشی هەمووخاڵەکاندا پێکەوە هاتبێتە گۆڕێ،بەڵکو هەلومەرجەکان لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر لەگۆڕاندابوون و لەکەلتورێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەبوە سەبارەت بەم جۆرە لەپیشە ، ئەگەر قایل بین بەپیشە ناوی بەرین .

---

بەشی دووەم

## لەشفرۆشی لەسەردەمی یۆناندا

یۆنانیەکان بەتایبەت لەئەسینادا کەنمونەیەکی باشی بنەما ڕەوشتیەکانیان بەخۆوە نەبینیەوە ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی یۆنانی کۆن لەڕووی ئەخلاقەوە لە ڕۆژهەڵات چوە تا لەڕۆژئاوا بچێت ،ئەوەی سەیرە لای یۆنان کەسێکسیان بەبنەمای خۆشەویستی زانیوە نەک بەپێچەوانەوە . باوک سالاریش یەکێکی تر بوە لەخەسڵەتەکانی کۆمەڵگای یۆنانی چونکە ئەوەندەی کۆت و پێوەند لەسەر ڕەگەزی مێینە هەبوە ئەوەندە لەسەر ڕەگەزی نێرینە نەبوە بەتایبەت پێش پرۆسەی هاوسەرگیری کەتیایدا نێرینە ئازاد بوە پاش خەوبینین بەڵام مێینە پێویستی زیاتری بەخۆپارێزی هەبوە لەڕوی سێکسیەوە .

لەناو ئەسینادا یاساکان ڕێگەیان داوە بەلەشفرۆشی و تەنانەت باجیشیان لە لەشفرۆشەکان وەرگرتوە ، ئەوەی لەڕوی ئەخلاقیەوە ناشیرین بوە تەنیا ئەگەر پیاوێک بەم کارە هەستابێت ئەوا لەلایەن ژنەکانیانەوە سەرکۆنە کراون یان لەناو شارەکەدا بەکەمتر سەیرکراون بەڵام وەک تاوان نەناسراوە . ئەوەی گرنگە بیزانین کۆت و پێوەندەکان لەسەر ژنان زیاتربوون * .

لەیۆنانی کۆندا بەشی هەرە زۆری یاساکان لەسەر بنەمای چینەکان دابەش بووبوو، هەر بۆیە یاسای لەشفرۆشیش بەپێی چینی جیاواز جیاواز ڕێگەی دابوو بە ژنان کەلەشفرۆشی بکەن . لەشفرۆشی یەکێک بوو لەو پیشانەی کەخەڵکێکی زۆر خەریکی بوون بەتایبەت لەشارێکی وەک ئەسینادا کەمەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و بازرگانی گرنگ بوو ، هەربۆیە چەند جۆرێکی جیاواز و چەند پسپۆڕیەکی تایبەت لە لەشفرۆشی بەپێی چینەکان هەبوە .

لەشفرۆشەکانی چینی پۆرنای لەقەراغ شار دەژیان و شوێنی نیشتەجێ بونیان زۆر پێشکەوتو نەبوە ،هەرکەس ویستبێتی توانیویەتی بەئاسانی بیاندۆزێتەوە چونکە (زەکەری پریاپۆس ) بەدەرگاکانیدا هەڵدەواسراو کرێی چوونە ژورووەش زۆر هەرزان بوە (یەک ئۆپڵە) . ناو ئەم خانوانە پربوە لەکچی جۆراو جۆر ، جلی تەنکیان لەبەرکردوە پێیان وتون (جمنایی)، ئەمانە لەهەمان خانەدا لێیان فرۆشراوە و لەبازاڕەکانی فرۆشتنی ئەم کەسانەدا هاوشێوەی بازاڕەکانی سەگ بوە . لەم ماڵانەدا ، کەبەزۆری خەڵکی بێگانە بەشارەکە سەردانی کردوون و توانیویانە هەندێک لەلەشفرۆشەکان بۆ ماوەی هەفتەو دە ڕۆژو مانگ بەکرێ بگرن .. ئەمانە بەزۆری لەسەر ئامێری قیسارە موزیک ژەن بوون و سەمایان کردووە بەجل و بەرگی زۆر تەنکەوە .

ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی بکەین ، لەبەر ئەوەی لەیۆناندا لەشفرۆشی کارێکی یاسایی بوە وەک هەر پیشەیەکی تری پزیشکی .. مامۆستایەتی .. سەیرکراوە .. بەڵام بەپێی چینەکانی جیاواز بوون ، هەربۆیە قوتابخانەی تایبەت بەخۆی هەبوە ، کەچۆن لەم شوێنانەدا فێربون . بەرزترین ئاست لەچینەکانلەشفرۆشی هیتارایی بوە، کەبەزۆری لەخەڵکی ڕەسەنی ئەسینا پێک هاتون ، نەک ڕۆژ هەڵاتیەکان وەک پۆرنای . ئاستی ئەم چینە زۆر بەرز بوە، کەلەوانەیە بڵێین هۆکاری چی بوە کەچینێکی ئاوا بەرز توشی لەشفرۆشی ببێت ؟ دەڵێین ئەمانە بەهۆی هۆکاری جیاواز جیاوازەوە لەماڵەکانیان دەرچوون ، ئارەزوویان کردوە ڕزگاریان ببێت لەژیانی تەنیایی و دەستیان داوەتە ئەم کارە .. پاش تەواوکردنی خوێندنێکی تایبەت بەلەشفرۆشی ، هەروەها بەلایەنەوە گرنگ بوە سەربەخۆ بژین لەخانویەکداو ئەو کارە بکەن ..

زۆربەی هەرە زۆریان گەنم ڕەنگ و برۆنزی بوون ، ڕەنگی قژیان زۆر زەرد کردوە چونکە باوەڕیان وابوە کەپیاوی ئەسینی ئارەزوی قژی زەرد ئەکات . بەڵام پێویستی بوە ئەمانە جلی گوڵدار لەبەر بکەن ، کەئەمەش یەکێک بوە لەیاساکانی ئەسیناو مەرجێکی سەرەکی بوە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی لەشفرۆشی .

هەروەک سەرەتا باسمان کرد لەشفرۆشی بەپێی چینەکان دابەش بوە ، شتێکی ناشیرین بوە بۆ پیاوان و ژنان بەڵام

لەڕووی ئەخلاقیەوە تابوو نەبوە، بەڵام بەڕێژەیەکی زیاتر بۆ ژنان ..بۆیە کاتێک پیاوان چونەتە لای لەشفرۆشەکان زیاتر شەرمەزاری لەوەدا بوە کەبچنەلای لەشفرۆشێک لەچینێکی نزم .. بەڵام بۆیان هەبوە شانازی بکەن بەچوونە لای لەشفرۆشێک لەچینێکی بەرزی وەک هاتایرایی .. هەربۆیە هەندێک لەلەشفرۆشەکانی چینی بەرز پلەو پایەی بڵندیان هەبوە بەهەمان ئاستی فەیلەسوفەکانی یۆنان .. بەنمونە: کربسترا یەکێک بوە لەوانەی کەعاشقەکانی بۆ چەند دەقەیەک 500 ئۆپڵەیان داوە .. ترجیلیا و میتهاری بۆ زیاتر لەهەفتا ساڵ خزمەتی سیاسەتمەدارەکانی یۆنانیان کردوە یەک لەدوایەک ..تیۆریس یەکێک بوە لەوانەی کەتەرخانکراوە بۆ گەنجکردنەوەی سۆفکلیز ..ئەرکیانسا ئەو لەشفرۆشە بوە کەتایبەت بوە بە ئەفلاتون ..دانی و لیۆنتیۆم لەڕووی سێکسەوە تەواو جیاواز بوون ،بەمامۆستای ئەبیقۆر دادەنرێن لەدارشتنی فەلسەفەی چێژدا .. تمستونوئی کاری لەشفرۆشی کردوە تاکەوتنی دوا ددانی و ڕوتانەوەی دواهەمین تاڵەکانی سەری .. ئائینای بەرامبەر یەک شەوی کچەکەی 1000 دراخمای وەرگرتوە ، یەک دراخما 100 ئۆپڵەیە دەکاتە نزیکەی 1000 دۆلاری ئەمریکی ، ئەم نرخە گرانەش چونکە نزیکەی هەشت ساڵ وانەی سێکسی بەکچەکەی وتوەتەوە و بەوردی فێری ئەم پیشەیەی کردوە ، یەکێک لەنهێنیەکانی بەرواجی ئەم کچە ، ئەوە بوە کە لەناو ئەسینادا زۆر جوان و پر پۆشاک بوە ( حیجاب بوە لەسەریەوە تا بەری پێی ) .

لەبەر ئەوەی لەیۆناندا لەشفرۆشی بەپیشە دانراوە ، ڕێزێکی تایبەتیشی بۆ دانراوە .. لەشفرۆشیش لەلای چینە بەرزەکاندا پێویستی بەبڕوانامەی بەرزو شارەزایی زۆر هەبوە لەبواری سێکسدا لەپاڵ جوانیدا .. بەنمونە : جوانی یەکێک بوە لەپێداویستیەکان بۆ ئەوەی لەشفرۆشەکە لەچینە بەرزەکان هەژمار بکرێت .

لەشفرۆشێکی وەک لئیس ،لەکاتی نوسینەوەی مێژووی شارەکاندا ، مێژوو نووسەکان شەرێکی زۆریان لەسەر کردوە بۆ ئەوەی بەلەدایک بونی شارەکانی ئەوان دەستنیشان بکرێت ..واتە زۆربەی زۆری مێژوو نووسی شارەکان شەڕیان بوە تالئیس بکەنە لەدایک بووی شارەکەی خۆیان .. ئەم لەشفرۆشە لەبەر گرانی خزمەتگوزاریەکانی کە گرانیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ جوانیەکەی ، هەروەها شارەزایی لەبواری سێکسدا .. زۆربەی زۆری هونەرمەندو نیگار کێشەکان تەنیا توانیویانە ئەوەندە پارە بدەن کەبەڕوتی ببینن .

چونە ژورەوە بۆ لای لئیس .. بۆماوەی یەک کاتژمێری لم بریتی بوە لە 5000 دراخما .. دەگێڕنەوە دەڵێن میلۆنی گەورە ، کاتێک لەپیریدا لئیسی دیوە ، هەموو موڵکەکانی خستوتە بەردەم بۆ ئەوەی شەوێک لەگەڵیدا بژی ، بەجوانترین ژنی دونیا ناسراوە ، بەڵام لئیس ڕازی نەبوە .. هەربۆیە میرۆن هەستاوە بەتاشینی ڕیشە سپیەکەی و دەستکاری ڕەنگی نینۆکەکانی کردوە و پارەیەکی زۆری لەچرچەکانی دەموچاویدا سەرفکردوە تا قایلی بکات ، تەنانەت دەڵێن جوانی لئیس و شارەزایی لەم پیشەیەدا کاریگەری هەبوە لەسەر گەڕانەوەی تین و گوڕی گەنجایەتی بۆ میرۆن .. کاتێک میرۆن دەچێتەوە بۆ لای لئیس و سور دەبێت لەسەر داواکەی ، لئیس دەڵێت : "چەند ڕۆژێک لەمەو بەر باوکت هەمان داوای لێکردم و هەموو سەروەتەکەی دامێ بۆ یەک شەو، بەڵام من ڕازی نەبووم ..بۆتۆ هەموو سەروەتەکەتم ناوێت ، بەڵکو بۆ هەموو سەعاتێکی لمین 5000 دراخمام دەوێت "

ئەمەش دوو ئاماژەی تێدایە : یەکەم لەلای لەشفرۆشێکی وەک لئیسیش ئەخلاقی تایبەت بەپیشەکەی هەبوە ، لەلای دوەمەوە ، لئیس توانیویەتی سەروەتێکی زۆر کۆبکاتەوە بەم ڕێگایە .. چونکە کرێی یەک شەوی لئیس 10000 دراخما بوە .

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسی بکەین ، لئیس دەست و دڵێکی باشیشی هەبوە، لەگەڕەک کوچە هەژارەکاندا گەڕاوەو خۆی گەنجانی هەڵبژاردوەو بەبێ بەرامبەر لەگەڵیان خەوتوە * .

---

## بەشی سێیەم

### لەشفرۆشی لەپاش یۆنانەوە تا 1800 پاش زایین

ئایینی مەسیحی لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا هاتە کایەوە و گەر باسی لەشفرۆشی لەماوەی مێژوویی 30 پ .ز تا 120 ساڵی ئەو سەردەمەش بکەین ئەوا دەبێت گفتوگۆکانمان لەسەر ئەخلاقی ڕۆمانی بێت لەسەردەمی قەیصەرەوە تا هاتنی مەسیحیەتیش بۆ نزیکەی ماوەی سەدەیەک .. لێرەدا دەڵێین ژیانی ئەخلاقی کەبەتەواوی لەژێر چاودێریەکی ورددا بوە بەتایبەت بۆ کچان و تارادەیەکیش زۆر گرنگ نەبوە بۆ کوانی لاو .. بەهەمان شێوەی سەردەمی یۆنان ئەو پیاوەی لەلەشفرۆش نزیکبوایەتەوە بەشێوەیەکی گشتی بەسووک سەیر کراوە .

لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا ئەم پیشەیە بەهۆی یاسایەکەوە ڕێکخرابوو کەتێیدا دەبوو لەشفرۆش لەدەرەوەی سنوری دیواری شارەکان بژین بەتەنها دەبوو لەشەودا کاربکەن فەرمانگەیەکی ڕەسمی هەبوو بۆ ناو نووسینی لەشفرۆشەکان و مۆڵەت پێدانیان .

لەشفرۆش پێویست بوو (تۆگە) لەبەر بکات لەبری ( ستۆلا ) تۆگە جلێکی ڕۆمانی بوو وەکو جبە بەڵام (ستۆرە) تۆزێک لە تۆگە درێژتر بوە . بەشێکی زۆری ژنانی ڕۆمان خۆیان ناونووس دەکرد بۆ ئەوەی لەسجلێکی ئەو فەرمانگەیە ناویان هەبێت نەکا ڕۆژێک بێت بە خەیاڵیاندا زینا بکەن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەسزاکانی زیناکردن کە زۆر قورس بوو . کرێی ئەم لەشفرۆشانە زۆر کەم بوو بەچارەکە ئاستێک بوو ( پارەی کۆنی ڕۆمانی ) ئەک یاسایانە لەشفرۆشیان زۆر قورس ردبوو کاتێکی زۆری وویستوە تابچێت دەرەوەی شار تا لەشفرۆشێکت دەستکەێت هەربۆیە توێژێک لەژنانی

ڕۆشنبیر دروست بوون کەئەم کارەیان کردوە بەناوی گۆرانی و مۆسیقاو سەماو گفتوگۆی فەلسەفەو شانۆوە ،کەئەمانەش هەمووی لەپێش شانۆکانەوە کراوە هەروەها پەرستگاکانیش بۆ ئەم کارە بەکار هاتوە تەنانەت مێژوو نوسەکانی مەسیح دەڵێن ژمارەی لەشفرۆشەکانی ڕۆمان بەقەدەر ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان بووە بەتەنها لەڕۆمدا ( 53000) لەشفرۆش هەبوە ئەمەش لەکاتێکدا کەزینا کردن زۆر بەتوندی سزادراوە . لەشفرۆشی نێرینەش هەبوە لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا .
لەئاینی یەهودی سیفاتی ئەخلاقی زیاتر لەسیفاتی ئەخلاقی ڕۆژهەڵات نزیک بووە تەنها یاسا توندەکانی ڕۆژهەڵات نەبووە لەشفرۆشیان لێ قەدەغە بکات بەڵکو ئەو یاسایانەی لەئەوروپا دەرچوە دژی لەشفرۆشی جێ بەجێیان کردوە سەرەڕای بەر بڵاوی فرەژنی لەناو جولەکەدا ەڵام کوڕان و کچانیان زۆر بەتوندی پارێزگاریان لێکراوە لەڕوی سێکسەوە . زۆر بەدگمەن سێکسی نێوان هەمان ڕەگەز هەبوە و ژنەکانیان بە پاکیزەیی ماونەتەوەو زۆر بەحەیاو حورمەت بوون لەڕووی سێکسەوە هۆکاری سەرەکی ئەەش دەگەڕێتەوە بۆ زوو بەشوودانیان .
بەپێی بۆچونی مێژوو نووسی گەورە ( وڵ دیوارند ) لەشفرۆشی لەناو جولەکەکاندا بەئەندازەیەک کەم بوە مرۆڤایەتی هەماوە جارێکیتر ناتوانێت بگەڕێتەوە ئەو دۆخە . ڕەبەنی پیاوان قەدەغە بوە هەر پیاوێک تەمەنی لە 20 ساڵ تێپەڕی بێت پێویست بوە هاوسەرگیری بکات دەنا بەپێی یاسا ئەم کارەیان ئەنجامداوە باوک ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە لەخێزاندا مافی هەبوە هاوسەرگیری کوڕەکەی یان کچەکەدەست نیشان بکات بەڵام پێویست بوە بەپێی یاسا خۆیان ڕازی بن هەر لەبەر ئەوەش توانیویەتی کچەکەی بەمنداڵی بە شو بدات . لەساڵەکانی ( 135 تا 565 ) هەموو بەشودانێکیش بەرامبەر بەبڕێک پارە بووە وامگەڵ تەڵاقداندا پێویست بوە ئەو بڕ پارەیە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی ( بەم جۆرەش دەتوانین بڵێین کە هاوسەر گیری بەپارە لەشفرۆشی نەبوە ئەوەندەی ڕەهنێکی کراوە بوە ) بەشێوەیەکی گشتی پلەو پایەی ژن زۆر نزم بوە تەنانەت لەکاتی نوێژدا پیاوان سوپاسی خوایان کردوە کەبەژن دروست نەکراون و ژنانیش سوپاسی خوایان کردوە کەبەزەوقی خۆی دروستیکردوون و پاڕاونەتەوە چیتر لەوان دروست نەکات .
بەپێی هەندێک لەیاساکانی پیاو سالاری لەسەردەمی یەهودا قەدەغە بوە ، ژن و مێرد لەبەردەمی خەڵکیدا بەگشتی قسەبکەن، مافی سەما کردنیان هەبوە بەڵام ژن لەگەڵ ژن و پێیاو لەگەڵ پیاو ..پیاو هەموو سەروەت و سامانی ژنەکەی بۆ ماوەتەوە بەڵام ژن هیچ مافێکی نەبوە لەمیراتی باوکیدا ئەگەر برای هەبوبێت بەڵام گەر برای نەبوبێت ئەوا هەقی هەبوە .

## ساڵەکانی (700 تا 1300) سەردەمی ئاینی مەسیحی

ژیانی مەسیحیەکان لەسەرەتادا پشتیان بەڕاوو شوانکارەیی بەستوە گرنگ بوو خواردنیان دەست کەوێت و وەپارێزگاری لە ژیان بکەن باروو دۆخی ئەوان بەجۆرێکبوە کە لەسەر سفرەو خوان دانیشتوون نەیان زانیوە ئایە جاری دووهەم خواردن دەبێتەوە یان لەبرسا دەمرن ، هەریۆیە بڕیاریان داە بەر بۆ ئارەزوە جنسیەکانیان بڵاو بکەنەوە.. کەس پابەند نەبوە بە هاوسەرگیریەوە لەبەرئەوەی ئاستی مردن زۆرتر بوە لە لەدایک بوون . هەموو ژنێک هەڵپەی کردوە بۆ ئەوەی منداڵی بێت هەموو پیاوێکیش هەڵپەی کردوە بۆ ئەوەی خواردن پەیدا بکات ، ئەوەی کەلەلای مەسیحیەکان تابوو بوە برینی بوو لەسێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵدا چ نێربوبێ یان مێ سزاکەشی بریتی بوە لەلەسێدارە دان واتە هەردوو ئاژەڵەکەش و هەم مرۆڤەکەشیان کوشتوە بەڕێگەی سووتاندن .
پەیوەندی سێکسی پێش هاوسەرگیری زۆر بەربڵاو بوە تەنها یەک هەفتە پێش هاوسەر گیری وازیان لەم جۆرە هاوسەر گیریە هێناوە . لەشفرۆشی هەبوە لەناو کۆمەڵگای مەسیحیەتدا بەشێوەیەک لەشێوەکان بەربڵاو بوە .ئەو منداڵانەی لەلەشفرۆشی درووست بوون خراونەتە بەر کاری سەربازی و زۆرێکیش لەپاڵەوانەکان لەم منداڵانە بوون وەک ( کۆشۆلان ، ئارسەر ، جاوین ، ڕۆلاند ، ولیەم ، فرۆی سارد ،... تاد ) لەناو مەسیحیەکانداو بەتایبەت لەناو سوپادا ژمارەیەکی زۆۆر لەژن هەبوون بەبەرگی پیاوانەوە کە لەجەنگەکاندا لەگەڵ سوپا دەیان بردن چونکە دەیان وویست کاتی داگیرکردنی شارەکان سەربازەکانیان مەشغوڵ نەبن بەدەست درێژی کردنی سێکسی بەنمونە کاتێک جەیشی فەرەنسی دەوری عەکە دەدات لەفەلەستین (300) لەشفرۆشی فەرەنسیان لەگەڵ دەبێت کاتێکیش سەربازی مسوڵمانانەکان ئەمە دەبینن داوای هەمان خزمەتگوزاری دەکەن . لەبەرامبەر ئەم خزمەتگوزاریانەدا ئەم لەشفرۆشانە مووچەی تایبەتیان هەبوو کەکەنیسە ڕێگەی پێدابوون یەکێک لەوانە ( قەشە تۆماس ئەکویناس ) بەڵام لەهەمانە کاتدا لەساڵی (1161) وە وردە وردە لەلایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە بۆیەکەم جار لەشفرۆشی لەو ژنانە قەدەغەکرا کەنەخۆشی لەش سووتانەوەیان هەبوە ئەمەش یەکەم جارە کە ڕەچاوی هەلومەرجی تەندروستی بکرێت لەبواری لەشفرۆشیدا .

## لەسەردەمی ڕاپەڕین 1300 تا 1534

سەردەمی ڕاپەڕین بەپلەی یەک لەئیتاڵیاوە دەست پێدەکات لەگەڵ لەدایک بوونی (پیترارک) سەرەڕای ئەوەی بیرۆکەی مەزن مەزن لەدایک بوو بەڵام ئەم سەردەمە هەژمار دەکرێت بەسەردەمی لەبەر یەک هەڵوەشاندنی بەها ئەخلاقیەکان ئەوەش سەرئەنجامی
مێژوویی 30 پ .ز تا 120 ساڵی ئەو سەردەمەش بکەین ئەوا دەبێت گفتوگۆکانمان لەسەر ئەخلاقی ڕۆمانی بێت لەسەردەمی قەیصەرەوە تا هاتنی مەسیحیەتیش بۆ نزیکەی ماوەی سەدەیەک .. لێرەدا دەڵێین ژیانی ئەخلاقی کەبەتەواوی لەژێر چاودێریەکی وردا بوە بەتایبەت بۆ کچان و تاڕادەیەکیش زۆر گرنگ نەبوە بۆ کوانی لاو .. بەهەمان شێوەی

سەردەمی یۆنان ئەو پیاوەی لەلەشفرۆش نزیکبوایەتەوە بەشێوەیەکی گشتی بەسووک سەیر کراوە ..
لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا ئەم پیشەیە بەهۆی یاسایەکەوە ڕێکخرابوو کەتێیدا دەبوو لەشفرۆش لەدەرەوەی سنوری دیواری شارەکان بژین بەتەنها دەبوو لەشەودا کاربکەن فەرمانگەیەکی ڕەسمی هەبوو بۆ ناو نووسینی لەشفرۆشەکان و مۆڵەت پێدانیان .
لەشفرۆش پێویست بوو (تۆگە) لەبەر بکات لەبری ( ستۆلا ) تۆگە جلێکی ڕۆمانی بوو وەکو جبە بەڵام (ستۆرە) تۆزێک لە تۆگە درێژتر بوە . بەشێکی زۆری ژنانی ڕۆمان خۆیان ناونووس دەکرد بۆ ئەوەی لەسجلێکی ئەو فەرمانگەیە ناویان هەبێت نەکا ڕۆژێک بێت بە خەیاڵیاندا زینا بکەن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەسزاکانی زیناکردن کە زۆر قورس بوو .
کرێی ئەم لەشفرۆشانە زۆر کەم بوو بەچارەکە ئاستێک بوو ( پارەی کۆنی ڕۆمانی ) ئەک یاسایانە لەشفرۆشیان زۆر قورس ردبوو کاتێکی زۆری وویستوە تابچێت دەروەی شار تا لەشفرۆشێکت دەستکەێت هەربۆیە توێژێک لەژنانی ڕۆشنبیر دروست بوون کەئەم کارەیان کردوە بەناوی گۆرانی و مۆسیقاو سەماو گفتوگۆی فەلسەفەو شانۆوە ،کەئەمانەش هەمووی لەپێش شانۆکانەوە کراوە هەروەها پەرستگاکانیش بۆ ئەم کارە بەکار هاتوە تەنانەت مێژوو نوسەکانی مەسیح دەڵێن ژمارەی لەشفرۆشەکانی ڕۆمان بەقەدەر ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان بووە بەتەنها لەڕۆمدا ( 53000) لەشفرۆش هەبوە ئەمەش لەکاتێکدا کەزینا کردن زۆر بەتوندی سزادراوە . لەشفرۆشی نێرینەش هەبوە لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا .
لەئاینی یەهودی سیفاتی ئەخلاقی زیاتر لەسیفاتی ئەخلاقی ڕۆژهەڵات نزیک بووە تەنها یاسا توندەکانی ڕۆژهەڵات نەبووە لەشفرۆشیان لێ قەدەغە بکات بەڵکو ئەو یاسایانەی لەئەوروپا دەرچوە دژی لەشفرۆشی جێ بەجێیان کردوە سەرەڕای بەر بڵاوی فرەژنی لەناو جولەکەدا ەلام کوڕان و کچانیان زۆر بەتوندی پارێزگاریان لێکراوە لەڕوی سێکسەوە . زۆر بەدەگمەن سێکسی نێوان هەمان ڕەگەز هەبوە و ژنەکانیان بە پاکیزەیی ماونەتەوەو زۆر بەحەیاو حورمەت بوون لەڕووی سێکسەوە هۆکاری سەرەکی ئەمش دەگەڕێتەوە بۆ زوو بەشوودانیان .
بەپێی بۆچونی مێژوو نووسی گەورە ( وڵ دیوارند ) لەشفرۆشی لەناو جولەکەکاندا بەئەندازەیەک کەم بوە مرۆڤایەتی هەماوە جارێکیتر ناتوانێت بگەڕێتەوە ئەو دۆخە . ڕەبەنی پیاوان قەدەغە بوە هەر پیاوێک تەمەنی لە 20 ساڵ تێپەڕی بێت پێویست بوە هاوسەرگیری بکات دەنا بەپێی یاسا ئەم کارەیان ئەنجامداوە باوک ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە لەخێزاندا مافی هەبوە هاوسەرگیری کوڕەکەی یان کچەکەدەست نیشان بکات بەڵام پێویست بوە بەپێی یاسا خۆیان ڕازی بن هەر لەبەر ئەوەش توانیویەتی کچەکەی بەمنداڵی بە شو بدات . لەساڵەکانی ( 135 تا 565 ) هەموو بەشودانێکیش بەرامبەر بەبڕێک پارە بووە واەگەڵ تەڵاقداندا پێویست بوە ئەو بڕ پارەیە بگەڕێنێتەه بۆ خاوەنەکەی ( بەم جۆرەش دەتوانین بڵێین کە هاوسەرگیری بەپارە لەشفرۆشی نەبوە ئەوەندەی ڕەهێنێکی کراوە بوە ) بەشێوەیەکی گشتی پلەو پایەی ژن زۆر نزم بوە تەنانەت لەکاتی نوێژدا پیاوان سوپاسی خوایان کردوە کەبەژن دروست نەکراون و ژنانیش سوپاسی خوایان کردوە کەبەزەوقی خۆی دروستیکردوون و پاراونەتەوە چیتر لەوان دروست نەکات .
بەپێی هەندێک لەیاساکانی پیاو سالاری لەسەردەمی یەهودا قەدەغە بوە ، ژن و مێرد لەبەردەمی خەڵکیدا بەگشتی قسەبکەن، مافی سەما کردنیان هەبوە بەڵام ژن لەگەڵ ژن و پێیاو لەگەڵ پیاو ..پیاو هەموو سەروەت و سامانی ژنەکەی بۆ ماوەتەوە بەڵام ژن هیچ مافێکی نەبوە لەمیراتی باوکیدا ئەگەر برای هەبوبێت بەڵام گەر برای نەبوبێت ئەوا هەقی هەبوە .

## ساڵەکانی (700 تا 1300) سەردەمی ئاینی مەسیحی

ژیانی مەسیحیەکان لەسەرەتادا پشتیان بەڕاوو شوانکارەیی بەستوە گرنگ بوو خواردنیان دەست کەوێت و وەپارێزگاری لە ژیان بکەن باروو دۆخی ئەوان بەجۆرێکبوە کە لەسەر سفرەو خوان دانیشتوون نەیان زانیوە ئایە جاری دووهەم خواردن دەبێتەوە یان لەبرسا دەمرن ، هەریۆیە بڕیاریان داە بەر بۆ ئارەزوە جنسیەکانیان بڵاو بکەنەوە.. کەس پابەند نەبوە بە هاوسەرگیریەوە لەبەرئەوەی ئاستی مردن زۆرتر بوە لە لەدایک بوون . هەموو ژنێک هەڵپەی کردوە بۆ ئەوەی منداڵی بێت هەموو پیاوێکیش هەڵپەی کردوە بۆ ئەوەی خواردن پەیدا بکات ، ئەوەی کەلەلای مەسیحیەکان تابوو بوە برینی بوو لەسێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵدا چ نێربوبێ یان مێ سزاکەشی بریتی بوە لەلەسێدارە دان واتە هەردوو ئاژەڵەکەش و هەم مرۆڤەکەشیان کوشتوە بەڕێگەی سووتاندن .
پەیوەندی سێکسی پێش هاوسەرگیری زۆر بەربڵاو بوە تەنها یەک هەفتە پێش هاوسەر گیری وازیان لەم جۆرە هاوسەرگیریە هێناوە . لەشفرۆشی هەبوە لەناو کۆمەڵگای مەسیحیەتدا بەشێوەیەک لەشێوەکان بەربڵاو بوە .ئەو منداڵانەی لەلەشفرۆشی درووست بوون خراونەتە بەر کاری سەربازی و زۆرێکیش لەپاڵەوانەکان لەم منداڵانە بوون وەک ( کۆشۆلان ، ئارسەر ، جاوین ، رۆلاند ، ولیەم ، فرۆی سارد ،... تاد ) لەناو مەسیحیەکانداو بەتایبەت لەناو سوپادا ژمارەیەکی زۆور لەژن هەبوون بەبەرگی پیاوانەوە کە لەجەنگەکاندا لەگەڵ سوپا دەیان بردن چونکە دەیان وویست کاتی داگیرکردنی شارەکان سەربازەکانیان مەشغوڵ نەبن بەدەست درێژی کردنی سێکسی بەنمونە کاتێک جەیشی فەرەنسی دەوری عەکە دەدات لەفەلەستین (300) لەشفرۆشی فەرەنسیان لەگەڵ دەبێت کاتێکیش سەربازی مسوڵمانانەکان ئەمە دەبینن داوای هەمان خزمەتگوزاری دەکەن . لەبەرامبەر ئەم خزمەتگوزاریانەدا ئەم لەشفرۆشانە مووچەی تایبەتیان هەبوو کەکەنیسە ڕێگەی پێدابوون یەکێک لەوانە ( قەشە تۆماس ئەکویناس ) بەڵام لەهەمانە کاتدا لەساڵی (1161) وە

ورده ورده لەلایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە بۆیەکەم جار لەشفرۆشی لەو ژنانە قەدەغەکرا کەنەخۆشی لەش سووتانەوەیان هەبوە ئەمەش یەکەم جارە کە رەچاوی هەلومەرجی تەندروستی بکرێت لەبواری لەشفرۆشیدا .

## بەشی چوارەم

لەسەردەمی راپەرین 1300 تا 1534
سەردەمی راپەرین بەپلەی یەک لەئیتاڵیاوە دەست پێدەکات لەگەڵ لەدایک بوونی (پیترارک) سەرەرای ئەوەی بیرۆکەی مەزن مەزن لەدایک بوو بەڵام ئەم سەردەمە هەژمار دەکرێت بەسەردەمی لەبەر یەک هەڵوەشاندنی بەها ئەخلاقیەکان ئەوەش سەرئەنجامی دەوڵەمەند بوونە کەوولاتی ئیتالیا یەکێک بوو لەو وڵاتانەی دەروازەیەکی گرنگی بازرگانی بوە لەنێوان رۆژ هەلات و ئەوروپای رۆژئاوادا لەم نێوەندەدا بازارو پارەو قەرز پێک هاتەی سەرەکی کۆمەڵگایەکی مەسیحی کراوە دەبن . بەزیاد بوونی پارە تاوان زیاتر دەبێت وەلەگەڵ دەوڵەمەند بووندا چیتر زاهید بوون نمونەی بڵندی ژیان وبەهای بەرزی ئەخلاقی نامێنێت بەم جۆرەش ژنان و پیاوان بێزاربوون لەو بنەما ئەخلاقیانەی کەلەسەردەمی هەژاری و ترسدا لەسەری راهاتبون بەڵکو ئێستا ئەو بنەمایانە بەپێچەوانە دەگۆررێت لەگەڵ غەریزە و زۆری پارەکانیاندا .کۆمەڵگای ئیتاڵی هێدی هێدی دەستی کرد بەگەرانەوە بۆ بنەما فیکریەکانی (ئەبی قۆر) کەدەڵێت مرۆڤ پێویستە چێژ لەژیان ببینێت ، وە هەموو ژێژەکان بێ تاوانن تائەو ساتەی بۆمان دەسەلمێت سەرەنجامی چێژ بینینێک تاوانێکمان کردوە .
هۆکاری دووەهەم لەپاڵ دەوڵەمەندی و پارەدا بۆ خراپ کردنی بنەما ئەخلاقیەکان ئە ململانێ و کوشتارە سیاسیە بوو کەلەناو پارتە سیاسیەکانی ئیتاڵیادا باو بوون .. زۆری جەنگ و سەربازە بیانیە بەکرێ گیراوەکان و و هاتوچۆی سوپای بێگانە بەناو زەوی و زارەکانی ئیتاڵیدا هۆکار بوون بۆ بلاوبونەوەی لەشفرۆشییەکی بێ وێنە چونکە زۆربەی زۆری سەربازە بیانییەکان هیچ پابەند نەبوون بەسنورە ئەخلاقیەکانەوە . ژێرخانی ئابوری بازرگانی و کشتوکاڵی و پیشەسازی تەواو تێکەڵاو بوو بوون بەهۆی جەنگەوە دەسەڵاتدارەکانیش دەسەڵاتێکی چەوسێنەر بوون ئەمانەش هەموو داب و نەریتێکی ئیتاڵیان تێکدا .
سەرتاترین بنەما بەڵگە لەهەموو فەلسەفەیەکی ئەخلاقیدا بریتیە لەرێک خستنی پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لەکۆمەڵگادا . مرۆڤ بەسروشتی خۆی ئارەزوی فرە سێکسی دەکات (واتە فرە هاوسەری ) هیچ شتێک نیە مرۆڤ قایل بکات بەیەک هاوسەر گەر سزایەکی سزایەکی توندو هەژاریەکی زۆرو گران نەبێت وەبەتەواوی لەژێر چاودێری هاوسەرەکەیدا نەبێت .
لەسەدەکانی ناوەراستدا کەمتر سێکسی حەرام باو بوە تا لەسەدەی راپەرین بەڵام لەسەدەکانی ناوەراستدا کەمتر باس لەمەترسیەکانی دەکرا (لایەنە خراپەکانی) بەتایبەت لەناو توێژی رۆشنبیردا بەڵام لەسەردەمی راپەریندا کارێکی وەک لەشفرۆشی قێزەونتربوو چونکە ژمارەیەکی زیاتر لەژنان هاتنە بواری کارکردن و کایە رۆشنبیریەکان ئەمەش پلەو پایەی ژنانی بەرز کردەوە بەشێوەیەکی گشتی ئەو بیروو بۆچونە نەما کەژنان تەنها غەریزە سێکسیەکانی پیاوان تێردەکەن لەپاڵ ئیشوکاری ناوماڵدا وەبەشێوەیەک لەشێوەکان بزوتنەوە سەرەتاییەکانی ژنان سەری هەڵدا نان جلوبەرگی رێک و پێکیان دەپۆشی و خۆیان دەپاراست لەپیاوان بۆ ئەوەی تەنها وەک کەرەسەیەکی سێکسی سەیر نەکرێن ژنێکی ناودار لەرۆمادا خۆی لەسێدارەدا بۆ رزگار کردنی شەرەفی خۆی و جەستەی بوە گەورەترین کەژاوەو گەورەترین خۆپیشاندان و هەموو ئەو مندالە ناشەرعیانەی کەلەئەنجامی لەشفرۆشی لەدایک بوو بوون لەم خۆپیشاندانەدا بەشدار بوون ململانێ و توندو تیژ لەنێوان مندالی شەرعی و ناشەرعیدا زۆر بلاو بوو . بەڵام هاو سێکسی (هۆمۆ سێچوەلی) بەشێوەیەکی زۆر بلاو بوو .
لەساڵی (1490) (6800) لەشفرۆش هەبوە لەرۆمادا کەنزیکەی 90000 کەسی تێدا ژیاوە بەڵام لە ڤینسیا ( 11654) لەشفرۆش هەبوە کە 300000 کەسی تیا ژیاوە ئەمانەش بەپێی بڵاو کراوەیەک کەناو و عنوان و کرێی لەشفرۆشەکانی تیا بڵاو بۆتەوە لەوکاتەدا ئەم لەشفرۆشانە لەسەر رێگە گازینۆکان دابەش بوون بەشێوەیەکی گشتی میوانداری گەنج و هونەرمەندیان کردوە ،و یەکێک لەوانە (متشیلینی) باسی شەوێک لەو شەوانە دەکات کەلای ئەم لەشفرۆشانە ماوەتەوە بەهەمان شێوەی باسکردنی نانێکی نیوەرۆ .. خاڵێکی گرنگ کەلێرەدا باسی بکەین دەوڵەمەندی و زۆری پارە یەکێک بوە لەو هۆکارانەی توانیویەتی دیاردەی لەشفرۆشی داپۆشێ و بیان پارێزێ لە یاسا قەدەغە کراوەکان .

### سەردەمی چاکسازی ئاینی ( 1517 تا 1564)

لەم سەردەمەدا سێکس بازارێکی تری دۆزیەوە ئەویش رەواج پەیداکردن یان سەرەتاکان ( پرۆنۆ گرافیا ) لەدونیای مەسیحی لاتینیدا هونەرمەندەکان دەستیان کرد بەپەیدا کردنی بازار بۆ وێنە سێکسیەکان و دەستگێرەکان لەبازار دەیان فرۆشت و کارمەندی بەریدو یاریچیەکانی سێرک و دەستگێرەکان باشترین نمونەی ئەم وێنەیان دەست دەکەوت .
تەنانەت لەرۆژنامە ( ئۆرۆستۆکراتیەکاندا) گۆشەیەک هەبوو بۆ (پۆرنۆ گرافیا) بەم جۆرەش داهاتی لەشفرۆشی بەشێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد بەڵام رێژەی نەخۆشیە بەرز بوەوە گەیشتە ئاستی پەتا هەربۆیە حکومەت لەوای

حکومەت دەستیان کرد بەقەدەغە کردنی ئەم ارەو یەکێک لەوانە (لۆتەر) کە ئارەزوە جنسیەکانی بەشتێکی ئاسایی دەبینێ لەپێناو ئەوەدایە کەلەشفرۆشی کەم بکاتەوە تەنانەت (میشێل دی لۆبیتەل) لەشاڵی (1560) یاسایەکی گرنگ دەردەکات بۆ ئازاد کردنی سێکس و قەدەغەکردنی لەشفرۆشی ئەمەش هەمووی لەپەراوێزی چاکسازی ئایندا.

---

## بەشی پێنجەم

---

### سەرەتاکانی سەردەمی ئەقڵ لەساڵی 1553_ 1643

لەم سەردەمەدا ئەقلانیەت بەسەر بیروباوەڕدا زاڵ دەبێت بەجۆرێک بیرو باوەڕی مەسیحیەت هەر بڵاوە و قەشەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و یاساکانی ئاین بۆ زیانی ئەخلاقی پەخش دەکەنەوە لەناو جوتیارەکانیشدا باوەڕ بەئاین و بەمەسیحیەت بەشێوەیەکی بەر فراوان بڵاوە . بەڵام بنەماکانیشی پێشێل دەکرێت ، لەشفرۆشی عەیبە و کڕینیشی هەر عەیبە بەڵام گەر کەس چاوی لێ نەبێت ئاساییە .

### > ساڵی 1715_ 1756

پەیوەندیە سێکسیەکان پێش هاوسەرگیری لەناو ژناندا کەمتر بڵاو بوو لەم ڕووەوە بەڵام لەشفرۆشی گەشتبوە لوتکە کەجارێکی تر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئە بارودۆخە بەخۆیەوە نابینێتەوە بەتەنیا لەناو لەندەندا(50000) لەشفرۆش هەبوو لەهەموو کافتریایەک هەموو چێشتخانەیەک هەموو ئوتێلێکی گەورە و بچوک هەموو مۆتێلەکانی سەر ڕێگا باخە گشتیەکان و دیسکۆکان ، شانۆکان، هەندێ دووکان هەبوو کەخۆیان تیا نمایش دەکرد.. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەیاسا هیچ بەزەیی پیایاندا نەدەهاتەوە گەر یەکێکیان لێ بگیرایە کاتێک ڕێ بەپیاوان دەگرن زیندانی دەکران و ئەشکەنجە دەدران ئەشکەنجەکە لەناو ئامێرێکی ئەشکەنجەداندا بوو کەپێی دەوترا (مەشهەرە) . گۆڤاری (جێرب ستریت) لەژمارە شەشی ئایاری ساڵی 1731 نووسیویەتی دایکی نیتهام دوێنێ ئێوارە تاوانبار کرا لەنزیک شەقامی (پنت جیمس) وە ئەوانەی لەشەقامەکەدا بوون سووکایەتی تەواویان پێکرد تائەو کاتەی لەهۆش خۆی چوو و بەدرێژایی مەشهەرەکە کەوت بەڵام هێشتا جەماوەرەکە بەرد بارانیان دەکرد بەتوندی و باوەڕیش وایە لەماوەی ڕۆژێک تا دوو ڕۆژ دەمرێت(لا 50) .
لەڕاستیدا ئامێرێکی واترسناکی ئەشکەنجە دان بۆ لەشفرۆشە دەوڵەمەندەکان نەبوو بەڵکو بەتەنها بۆ هەژارەکان بوو چونکە دەوڵەمەندەکانیان بەرتیلیان ئەدا کڕیارەکانیش دەهاتن بەکەفالەت بەرەڵایان دەکردن یان هەندێکیان هەبوون زۆر ناسراو بوون لەگەڵ دامەزراوەکانی پۆلیس و یاسدا بەرژەوەندییەکی دوو لایەنەیان هەبوو .
یەکەم نوسراوی زانستی کۆمەڵایەتی ساڵی 1749 بڵاو کرایەوە بەناوی یادەوەریەکانی لەشفرۆشێک تائێستاش بەقێزەونترین کتێبەکانی ئەو سەدەیە هەژمار دەکرێت و لە هەمووشیان زیاتر ڕەواجی هەبوو لەنووسیتی (جۆن کلیلاند) بەم جۆرەش لەو سەردەمەدا لەشفرۆشی بەئەندازەیەکی زۆر بڵاو بۆوە لێیان گیراوە و لێیان لەسێدارە دراوە لەناو بەریتانیادا .. بەجۆرێک وردە وردە خەڵکی ئەو وڵاتە دەستیان کرد بەهەڵاتن بۆ سنورەکانی (ئوسکوتلەندا) و ئەم دیاردەیەش بۆ ماوەی پەنجا ساڵ درێژەی هەبوو هەتا بەبڕیارێک لەلایەن پەرلەمانی ئەو وڵاتەوە چارەسەر ئەکرێت بەڵا لەهەمان سەردەمدا لەفەرەنسا لەشفرۆشی لەناو هەژارو دەوڵەمەنمدەکان بڵاو بوو سزای هاوسێکسی کوشتن بو بەسوتاندن بەڵام ئەم سزایە بەتەنیا لەسەر هەژارەکان پیادە دەکرا .. لەماوەی دیاریکراودا لەنێوان هەموو دەوڵەمەندەکانی فەرەنسادا بەتەنیا شوانیەکەم سزای بەسەردا درا لەساڵی 1724 ئەم شوانە قەشە بوو بەناوی (دیڤئۆنیتن) کە (ڤۆلتەری) شاعیر هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئازاد کردنی. جیی لەلەشفرۆشیدا دەتوانین بکەین لەفەرەنسادا لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکان ئەوەیە ەئەو پارەیەی دەوڵەمەندەکان دەستیان دەکەوت زۆر بەکامەرانی و خۆشی پێی دەژیان بەڵام هەژارەکان بەشی ژیانێکی ئاسایی نەدەکردن هۆکارەکەش لەپشت ئەم بازاڕەوە ئەوە بوو کەخاوەن کارەکان کرێی پێویستیان نەداوەتە کرێکارەکانیان ، و مەزەندە دەکرێت کەبەتەنها لەناو پاریسدا ( 40000) لەشفرۆش هەبوە بەشێوەیەکی گشتی شەقامی فەرەنسی ئەم کارەی بەئاسایی زانیوە چونکە باوەڕیان وابوو کەقەشەو چینە( ئۆرستۆقراتەکان) ئەم دیاردەیەیان دروست کردوە گەر ئەوانیش نەبونایە ئە ژناە لەشفرۆشیان نەدەکردبەڵام هێشتا پلەو پایەی لەشفرۆشەکان لەخوار ترەوە بوە لەچاوی کڕیارەکاندا بەڵام لای پۆلیس جیاواز بوە بەبێ شکات دەسکاری لەشفرۆشەکانیان نەکردوەو لەکاتی شکات کردنیشدا بەپۆل دەستگیریان کردون .. سەریان تاشیون و خراونەتە ژێر چاودێریەوە . ئەو لەشفرۆشانەی کەلەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا بوون جۆرێک حەیانەیان هەبوە قابیلی گرتن نەبونچونکە دەچوونە ماڵی دەوڵەمەندەکان و یان دەرفەتیان دەبوو لەشانۆکاندا هەندێک ڕۆڵ ببینن وەکئەکتەر وەکاتێکیش بە هونەرمەند هەژمار بکرانایە چیتر قابیلی گرتن نەبون..
خاڵێکی گرنگ هەیە کەپێویستە لێرەدا باسی بکەین : خیانەتی زەوجی عەیب نەبوە و بەیەکێک لەڕێگەچارەکان دانراوە بۆ بێزاربون لەژیانی هاووسەرگیری بەڵکوو لەهەندێک شاری فەرەنسیدا خیانەتی زەوجی یەکێک بوە لەداب و نەریتەکان کە پێویست بوە بکرێت .

---

## بەشی شەشەم

### لەشفرۆشی لەسەدەی نۆزدەهەمدا

وەک دەزانین لەسەدەی نۆزدەدا گەرمەی گوڕو تینی شۆڕشی پیشەسازی و سەرهەڵدانی زانستی کۆمەڵناسی و دەرکەوتنی بنەماکانی زانستی دەرونزانی بوە ، هەربۆیە توێژینەوەکانیشە لەسەر لەشفرۆشی زیاتر وردتر و قوڵتر بونەتەوە و زۆرێک لەڕەوتە فێمینیستیەکان دەرکەوتن و ڕێچکەی خۆیان دیریکردو ڕای تایبەتیان لەسەر لەشفرۆشی هەبوو..
لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا تەواوی کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان سەرقاڵی کارکردنێکی زۆر بوون هەموومرۆڤێکی پێگەیشتوو زیاتر لە 12 کاتژمێر کاریکردوە ڕۆژانەو هەر لەسەردەمی ڕاپەڕینیشەوە پەیوەنیە سێکسیەکان وەک پێویستیەک ئازادکراون،هەربۆیە ڕێژەی لەشفرۆشی لەم سەدەیەدا بەبەراورد لەگەڵ ئەو سەردەمانەدا کە بەجێگیرتر هەژمار کراون کەمتر بوە، ئەمەش سەرەڕای ئەوەی لەشفرۆشی بارێکی زیاتر جێگیرو ڕێکخراوی بەخۆوە بینیوە لەلایەن دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە .
شایانی باسە کەڕەوتە فێمینیستیەکان و فەلسەفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری بەشێوەیەکی بەرچاو دژی لەشفرۆشی وەستاونەتەوە و هەربۆیە لەم کاتانەدا کەمتر بوە، بەتایبەت زۆربەی ململانێکانی ئەم سەردەمانە ململانێی دەسەڵات یان پاوانکاری بازاڕەکانی جیهان بوون و مرۆڤ زیاتر گرنگی بەدۆزینەوەکان داوە ، وەک دۆزینەوە جوگرافیەکان و داهێنانەکان لەبواری زانستی جیاوازدا ، سەرەڕای ئەمەش بازاڕێکی گەرم بۆ لەشفرۆشی نەبوە بەبەراورد لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی بیست یان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ، چونکە لەسەدەی نۆزدەدا زۆربەی جەنگەکانیش جەنگی دەسەڵات و پاوانکاری بوون بۆ دۆزینەوەی بازاڕ هەروەها بەشێوەیەکی ڕێژەیی سێکس ئازاد کراوە کەزیاتر دەرفەتی داوە بەکەمکردنەوەی لەشفرۆشی .

< لەشفرۆشی لەسەدەی بیستدا

لەدونیای بازاڕەکانی سەرمایەداریدا لەشفرۆشی لەڕێگای پۆرنۆ گرافیاوە پێدەنێتە قۆناغی بەفیلمکردنەوە سەرەتاکانی فیلمی سێکسی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیست ، هەروەها سەرهەڵدانی تیۆرە دەرونیەکانی فرۆید کەبەشێوەیەکی سەرەکی پشت دەبەستێت بەدەرونشیکاری و پاشانیش زۆربەی دیاردە دەرونیەکان بە ڕەوشی سێکچواڵیتی مرۆڤەوە دەبەستێتەوە ، هەربۆیە شەرعیەت و ڕێکخستنێکی زیاتر بەسێکس درا ، ئازادی سێکس لەئەوروپاو ئەمریکادا تەواو بەربڵاو بوو ، بەڵام هێشتا ئەم ئازادیە نەبوە هۆی داخستنی بازارەکانی لەشفرۆشی ، بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆربەی شارە گەورەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی ئاشکراو بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەشفرۆشی تیایاندا لەبرەودا بوو ،هەروەها لەزۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا لەشرۆشی لەبارێکی ڕێکخراودا دەگوزەری.. لەماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا لەشفرۆشی برەوی سەند لەئەوروپای ڕۆژئاوادا بەهۆیئەو قەیرانە ئابوریەوە کەتەواوی بازاڕەکانی سەرمایەداری گرتبوەوە ،بەڵام لەڕۆژهەڵات و بلۆکی سۆشیالیستیدا لەشفرۆشی ژیانی دابینکردبوو ، هەروەها بەئەندازەیەکیش ئازادی سێکس بەربڵاو بوو .
لەپاش جەنگی جیهانی دوەمەوە بازاڕیلەشفرۆشی تەواو بەسترایەوە بەبازاڕەکانی تری وەک مۆدەو جوانکاری پێویستیەکانی ترەوە،ئەگەرچی لەم ماوەیەدا..ئەم بازاڕە ئازادیەکی باشی بەخۆوە بینی بەڵام لەپێش و تر زیاتر پابەندبوو بەتێکڕای کایە ئابوریەکانەوە، چونکە بەشێوەیەکی ڕێکخراو بازرگانی سێکسی دەکراو ئەمەش ئاستێکی دیاری کراوی خۆی هەبوو بۆ تێربون، هەروەها لەکۆتایی شەستەکانەوە و لەگەڵ سەرەتاکانی ساڵانی هەفتای شەدەی ڕابردودا ڕەوت و ئاراستە فێمینیستی و جێندەریەکان زیادیان کردو دژایەتیەکی بەرچاویان بۆ ئەو تێڕوانینە هەبوو کەسەبارەت بەلەشفرۆشی هەبوو بوون ،کە تائێستاش هەندێکیان بەردەوامن .. ئەوەی شایەنی باسە لەناوەڕاستی سەدەی بیستەوە تائەمڕۆش ڕەوتی هۆمۆسێکچواڵیتی گەشەی کردوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ یاساکانیان بۆ هەموارتر دەکرێت و لەم پەیوەنیەشدا لەشفرۆشی بەڕێژەیەکی زیاتر لەناو پیاواندا بڵاو دەبێتەوە گەر بەراوردی بکەین بەتەواوی هەموو ماوە مێژوویەکانی مرۆڤایەتی کەنزیکەی 4000 ساڵی نوسراو یان ڕاسترە بڵێین دۆکیومێنتکراو دەبێت .

< شۆڕشی سێکس لە کەلتوری ڕۆژئاوایدا

لەدوو سەدەی ڕابردودا سێکس و خۆشەویستی گۆرانکاری گەورەیان بەخۆوە بینیوە، لەسەرەتاکانی سەدەی ڕاپەڕینەوە (1837- 1901) خۆشەویستی و سێکس دوو شتی لەیەک جیاواز بوون و باسی مەسەلە سێکسیەکان لەنێوان هەمان ڕەگەزدا بەئاشکراو کراوەیی نەدەکرا . هەمیشە سێکس بەمەترسیەکی گەورە دەزانرا بۆ خۆشەویستی و باوەڕ وابوە خۆشەویستی یەک گرتنی نێوان دوو ڕۆحە بەڵام هەرچی سێکسە لەکاتی هاوسەرگیریا ڕوودەدات و بەشێکە لەهاوسەرگیری وپێویستە بەتەواوی کۆنترۆڵ بکرێت ، دەنا مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی ئەم هەستەی .
برێکی زۆر لەم بیرو بۆچونانە پاشماوەی سەدەی نۆزدە بوون کەلەسەدەی بیستیشدا بەکاهێنرا بەڵام لەدوای جەنگی

جیهانی دووەمەوە گۆڕانکاریەکی زەبەلاح دەربارەی ژیانی سێکچوەڵەتی ڕووی دا بەتایبەت لەشەستەکاندا کەئەم گۆڕانکاریانەش لەڕەفتاری سێکس و بەهاکانی و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا ڕەنگیان دەدایەوە .
ئەوەی کەبەشۆڕشی سێکسی دەناسرێتەوەە لەنێوان (1960-1970) دا بریتیە لەئازادی تەواوی ژنان و پیاوان لەسێکس کردندا هەروەها بەڕێژەیەکی کەمتر ئازادی سێکسی نێوان ژن و ژن هەروەها بەڕێژەیەکی کەمتریش ئازادی سێکسی نێوان پیاو پیاو.
لەلایەکی ترەوە فێربون دەربارەی مەسەلەکانی سێکسۆلۆجی زیادی کرد هەروەها ڕاهێنانیش لەم بوارەدا بۆ ئەوانەی توشی لاوازی بوون عیادەو شوێنی تایبەتی بۆ کرایەوە گرنگە دان بەوەدا بنێین کەتیۆریەکانی (سیگمۆن فرۆید) و هەموو ئەو توێژینەوانەی کەسێکسۆلۆجیستە ئەوروپیەکان کردویانە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر ئەم گۆڕانکاریانە.
ئەم شۆڕشە لەئەوروپادا لەسەر هەموو جیهان ڕەنگی دایەوە شایەنی باسە لەشفرۆشیش کەلەم پەراوێزەدا دەرفەتی زیاتری بۆ کراوەتەوەو ئاسانتر توانیویەتی بەهۆی ئەو توانا ئابوریە شاراوەیەی کەتێیدایە هەندێک کۆسپ لەبەردەم خۆیدا لابەرێت کەبەتنها بەهۆی ئازادی سێکسی یەوە دروست ناکرێت.
شایەنی باسە گەشەکردنێکی بەرفرەی نەخۆشیە نهێنیەکان بڵاو بوونەوە ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ هەڵوێستی هەندێک لە وڵاتان بەرامبەر ئازاد کردنی لەشفرۆشی هەروەها بڵاو بوونەوەی بازرگانی بەمرۆڤەوە بەمەبەستی سێکس یەکێکی تر بوو لەو هاندەرانەی ڕێکخراوە جیهانیەکان و نەتەوە یەکگرتوەکانی ناچار کرد کەڕێکەوتننامەو بروانامەی جۆراو جۆر لەم بارەیەوە دەربکەن و مۆریان بکەن .
لەسەرتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا بازاڕەکانی سێکس لەشفرۆشی تێدەپەڕێنێت و بەهۆی هاتنە کایەی ئامێرو کەرەسەکانی ماس میدیاوە هەروەها لەگەڵ گەشە کردنی ئەنتەرنێت و سەتەلایتا لەشفرۆشی و بازرگانی بەمرۆڤەوە بەمەبەستی سێکس دەبێتە دیاردەیەکی جیهانی و هۆکارێکی گرنگ بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمەکانی (پۆرنۆگرافیا)
لەلایەکی ترەوەدەتوانین بڵێین پێشکەوتنی زانستی و پزیشکی زۆری هۆیەکانی سنوربەند کردنی منداڵ بوون هاندەرێکی تر بوون بۆ بەربڵاوی لەش فرۆشی چوونکە کاریگریە نێگەتیفەکانی لەشفرۆشیان کەمکردۆتەوە لەسەر ئاستی تاکەکەس ،سەرەڕای زۆری و بەربڵاوی نەخۆشیەکان .

---

نۆڤیانۆسێک لە تاوان .... بەشی حەوتەم

جۆرەکانی لەشفرۆشی لە کوردستاندا

ئەم بازاڕە لەکوردستاندا بازاڕێکی نهێنیە چونکە بەپێی ئایین و یاسا و کەلتور کارێکی ناشیرینە وتائێستاش ڕێگەی پێنەدراوە ، هەربۆیە ئەم بازاڕە ڕەواجی زیاترە لەکوردستاندا و کەمتر دەتوانرێت بەڕێگای یاسایی سنووری بۆ بکێشرێت . هەربۆیە شێوە باوەکانی لەشفرۆشی کە لەجیهاندا باون گۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەکوردستاندا وەک شێوە جیهانیەکەی نەماونەتەوە . جۆرەکانی لەشفرۆشی لەکوردستاندا لەباوترینیانەوە بەم شێوەیەی خوارەوە ڕیزبەندیان بکەین :
1- خانەکانی لەشفرۆشان :
بریتیە لەو خانوانەی کە کەسێکی تیادا دەژی لەسەر شێوەی خێزان بەڵام بەکاردەهێنرێت وەک بازاڕێکی سێکسی بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری سێکسی بە کڕیارەکان . ئەم خانانە دەستاودەست ژمارەی مۆبایل و ناونیشانی خۆیان بڵاودەکەنەوە لەڕێگەی کڕیارەکانەوە ، بەمجۆرەش کڕیارەکان خەڵکی تر ئاگاداردەکەنەوە و مشتەری بۆ خانەکان زیاد دەبێت و گەشە دەکات . جێی باسە ئەم خانانە هەندێک کات دەگۆڕێن بەهۆی باری ئەمنی و سروشتی و کۆمەڵایەتیەوە .
باری ئەمنی هەڕەشە دەکاتە سەر ئەم خانانە چونکە بەپێی یاسا و سروشتی کۆمەڵایەتی قەدەغەیە ، بەڵام کاتێک باس لەسروشتی کۆمەڵایەتی دەکەین گرنگە بزانین کە خانەکان بەردەوام شوێنی خۆیان ئاڵوگۆڕ دەکەن تاوەکو خۆیان بپارێزن لەگازندەی گەڕەک و کۆڵانەکانیان ( هاوسێکانیان ) ، گرنگە ئەوە بڵێین کە بەپێی یاسا گەڕەکەکان بۆیان هەیە گازندە لە لەشفرۆشێک تۆمار بکەن و دەری بنێن لەگەڕەکەکەیان . ئەم خانانە بەزۆری ئەو لەشفرۆشانە دەگرنە خۆیان کەشوێنی تایبەت بەخۆیانیان نیە و ناچارن لەم خانانەدا بژین .
2- خستنەڕووی تاکە کەس :
بازاڕی دووەمی ئەم کارە لەسەر ئاستی تاکە کەس بەڕێوە دەچێت کەخۆیان دەخەنە ڕوو لەشوێنە جیاوازجیاوازەکاندا .
بەپێی چەشنی دووەم کەسێکی لەشفرۆش جلوبەرگ و ئارایشتەکانی بەجۆرێکن کە کڕیاری سێکسی تێدەگات لە لەشفرۆش . یان شێواز و ئەتەکێتی ئاخافتنیان بەجۆرێکە ئەو خزمەتگوزاریە سێکسیانە دەخاتە ڕوو . بەزۆری بازاڕی تاکەکەس ڕوو دەکەنە ئارایشتگاکان و فرۆشگەکانی جوانکاری و زەڕەنگەرەکان و ... هتد ، هەروەها لەڕێگەی شۆفێرەکانی تاکسیەوە .

3- بەرێگای بانگەشە بۆکردن :
هەر لەبەر هەمان ئەو هۆکارە گشتیانەی کە لەسەرەتاوە باسمان کرد ، بانگهێشت و ریکلام بۆ هۆکارێکی وا لەکوردستاندا بەنهێنی دەکرێت ، ئەمەش بە دوو جۆر :
جۆرێکیان بانگەشە و ریکلامی کڕیار و فرۆشیارەکان خۆیانە ، بەنموونە کاتێک کڕیارێک یەکێک لەخانەکان ئەدۆزێتەوە بانگهێشت بۆ ئەو خانانە دەکات لەناو هاوڕێ و کەسە نزیکەکانیدا بەم جۆرەش بازاڕ گەرمیەک لەبازاڕی سێکسیدا دەگوێزرێتەوە لەرێگەی ئەم ریکلامە نهێنیانەوە .
جۆری دووەمیان لەرێگەی دەلالەکانەوەیە ، هەریەکێک لەخانەکان و لەسەرۆک باندەکانی لەشفرۆشی چەند دەلالێکیان هەیە لەناو بازاڕدا وەک شۆفێر تاکسیەکان و دوکانی کەمالیاتەکان ، ئارایشتگاکان و ... هتد .
4- جۆری دووەمی خانەکانی لەشفرۆشی :
ئەو خانانە کە لەشفرۆش لەخۆ ناگرێت بەڵکو تەنها رێگە دەدات بە دوو کەس کە کڕیار و فرۆشیاری سێکس بن بەرامبەر مانەوەیان لەماڵەکەدا ئەو کارە دەکات و هەندێ جاریش مەرج نیە دوو کەسەکە کڕیار و فرۆشیار بن بەڵکو هەندێ کات دوو خۆشەویست یان دوو برادەریش کە پەیوەندی سێکسیان لەنێواندا هەیە ڕوو دەکەنە ئەم ماڵانە لەبری جێگەی مانەوەکەش برە پارەیەک دەدەن .
هەندێ تێبینی گشتی لەسەر کاری لەشفرۆشی لە کوردستاندا :

1- زۆربەی ماڵەکان رێگە نادەن کڕیار و فرۆشیارەکان شەوان بمێننەوە .
2- لە کوردستاندا ( ئێسکۆرد ) ( مصاحەبە ) لەرێگەی خانەکانەوە بەرێ دەکرێت و ئەوەش لەسەر داوای هەندێک لە کڕیارەکان بەتایبەت ئەوانەی کە توانایەکی دارایی و دەسەڵاتێکی دیاریکراویان هەیە .
3- باشترین هۆکاری یاریدەدەر بۆ بەرێکردنی ئەم خزمەتگوزاریە ، مۆبایلە .

چەند ئامارێکی جیهانی سەبارەت بە لەشفرۆشی :

زۆربەی هەرەزۆری لەشفرۆشەکانی جیهان دووچاری توندوتیژی سێکسی دەبنەوە ، زیاتر لە 90% لەشفرۆشەکان هەر لەمنالیەوە دەستدرێژی سێکسیان لێکراوە ، زۆربەیشیان لەرێگەی بازاڕەکانی کارکردنەوە دووچاری ئەم جۆرە لەتوندوتیژی دەبن و ئالودە دەبن بە لەشفرۆشیەوە . 75% دووچاری ئیغتیصاب دەبنەوە . لایەنی کەم دوو لەسەر سێی لەشفرۆشەکان پێش ( 16 ) ساڵی فێری ئەم کارە دەبن و وەک رێگەچارەیەک بۆ دەربازبوون لەژینگەی خراپی خێزانی بەکاریدەهێنن ، هەروەها وەک تاکە رێگە چارەیەک دەیبیننەوە .

ئامارەکان :

* یەک ملیۆن لەشفرۆشی ژن و کچ لە دونیادا هەیە و 1% ی ژنانی ئەمەریکایی لانیکەم بۆ چوار ساڵ لەشفرۆشیان کردووە .
* 0.5 بۆ 1.2 ملیۆن منال لەبازرگانی سێکسیدا بەکاردەبرێن ، کە نزیکەی 0.3 لە رەگەزی نێرن و لەخوار ( 16 ) ساڵەوەن ، هەروەها یەکێکی تر لەتوێژینەوەکان دەریانخستووە کە 78% ی لەشفرۆشەکان لەتەمەنی هەرزەکاریدا فێری ئەو کارە بوون و 60% لەخوار شانزە ساڵیەوە بوون و هەندێکیشیان لەدەوروبەری دە ساڵاندا بوون .
* 60% منالانی لەشفرۆش لەلایەن خەڵکی رێزدارەوە دەخرێنە بەر ئەم ئیشە و تەنانەت زۆربەیان لەو منالانەن کە هەڵدێن لە ماڵەکانیان و رێگایەکی تر شک نابەن کە بەهۆیەوە بتوانن پارە پەیدا بکەن .
* 27% ئەو نێرینانەی کە لەلەشفرۆشیدا دەستگیر دەکرێن لەلایەن پۆلیسەوە ، کاری پۆرنۆگرافیان کردووە ، کە بەگشتی نێرینەکان کەمتر دەستگیر دەکرێن .
* بەپێی زۆربەی توێژینەوەکان دوو لەسەر سێی ئەوانەی لەشفرۆشی دەکەن لەو خێزانانەن کە هەژاری یەکێکە لە گرفتە سەرەکیەکانیان .
* زۆربەی زۆری لەشفرۆشەکان دەڵێن کە دایک و باوکیان بەشێوەیەکی بەرچاو دەخۆنەوە یان مادەی سڕکەر بەکاردەهێنن و لەهەمان کاتیشدا سەردانی مەزارگە و شوێنە ئایینیە پیرۆزەکان دەکەن .
* 51% ی ئەوانەی لەشفرۆشی دەکەن دەڵێن لە منالیدا دەستدرێژی سێکسیان لێکراوە .
* 19% ی لەشفرۆشەکان دەڵێن پەیوەندیەکی باشمان لەگەڵ باوکماندا هەیە و بەپێچەوانەوە رێژەیەکی زۆرکەم دەڵێن کە پەیوەندیەکی خراپمان لەگەڵ دایکماندا هەیە .
* زۆربەی هەرەزۆری سەرچاوە و توێژینەوەکان دەڵێن کە ئیغتیصاب یان دەستدرێژی سێکسی لەمنالیدا دەبێتە هۆی هەستکردنێکی بەردەوام بە پەراوێزی و هەرەشە لەسەر بوونی مرۆیی و هەمیشە هەست بە تاوان دەکەن و هەست دەکەن کە تەواو ئەوان جیاوازن لە خەڵکی تر و هەمیشە هەست دەکەن لە خەڵکێکی تر کەمترن ، بۆیە هەوڵ دەدەن کە ئەو دەستدرێژیە بکەنەوە سەر خەڵکێکی تر ، هۆکاری سەرەکی ئەمەش بریتیە لە تۆڵە بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرا ناوترێت

. بەزۆری لەشفرۆشەکان بەم قۆناغەدا ڕۆیشتوون .
* دوو لەسەر سێی ئەوانەی لەشفرۆشی دەکەن لەتەمەنی سێ تا شانزە سالی دەستدرێژیان کراوەتە سەر و تێکڕای ئەوانەی دەستدرێژیان کراوەتە سەر ئەوانەن کە تەمەنیان دە ساڵانە .
* زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی لەمناڵیدا دەستدرێژیان دەکرێتە سەر ئەوانەن کە لەلایەن کەسی نزیکیانەوە ئەم کارەیان بەرامبەر دەکرێت و پاشان ئەوانەی کە لەلایەن خەڵکی نەناسەوە ئیغتیصاب دەکرێن لەمناڵیدا تەنیا 10% لەشفرۆشەکان پێک دەهێنن .
* بەشێکی زۆری ئەو کچانەی لە مناڵیدا ئیغتیصاب دەکرێن کچێنی خۆیان لەدەست دەدەن و ڕێژەکەیان دەگاتە 90% و تەنانەت ئەوانەی لەشفرۆشی دەکەن نزیکەی 70% ئەوانەن کە ئیغتیصاب کردنیان لەمناڵیدا زۆر کاری کردۆتە سەر بڕیارەکانیان بۆ ئەوەی ببنە لەشفرۆش .
* گەر تێبینی بکەین دەبینین ژمارەی ئەوانەی لەسەر لەشفرۆشی دەگیرێن 27.7 جار کەمترە لەژمارەی ئەو مناڵانەی کە لەمناڵیدا دەستدرێژی سێکسیان دەکرێتە سەر
* 57% ی ئەوانەی لەشفرۆشی دەکەن دەڵێن دەستدرێژی سێکسیمان کراوەتە سەر لە مناڵیدا ، 49% یشیان دەڵێن بەشێوەیەکی کرداری دەستدرێژی سێکسیمان لێکراوە .
* ئەوانەی کاری لەشفرۆشی دەکەن دەڵێن :
- 82% بەشێوەیەکی فیزیکی سووکایەتیان پێکراوە .
- 83% بەهۆی چەکەوە هەڕەشەیان لێکراوە .
- 68% ئیغتیصاب کراون کاتێک وەک لەشفرۆش کاریان کردووە .
- 84% لەئێستادا یان لەڕابردوودا بێ لانەییان چەشتووە .
* یەکێک لەتوێژینەوەکانی تر سەبارەت بەلەشفرۆشی گەورە دەریخستووە کە :
- 73% ئیغتیصاب کراون
- 84% ئەوانەی ئیغتیصاب کراون لەلایەن خەڵکی نەناسەوە ئیغتیصاب کراون .
- 27% ئەوانەی ئیغتیصاب کراون دەڵێن زیاتر لە کەسێک پێکەوە دەستدرێژیان لێکردووین و تێکڕا لە چوار کەس کەمتر نەبوون .
- 44% ئیغتیصاب کردنەکان چەکی تیا بەکار هاتووە .
- 73% ئەو لەشفرۆشانەی دەڵێن ئیغتیصاب کراوین ، لەگەورەییدا ئیغتیصاب کراون و کاریگەری ئیغتیصاب کردنەکانیان لەسەر جەستە ماوەتەوە و بەزۆری بریندار کراون .
* نەخۆشیە باوەکان و خودکوژی ، دوو باوترین نەخۆشین لەنێو ئەو گەنجانەدا کەفێری لەشفرۆشی بوون .
* 15% ی هەموو ئەوانەی خۆیان دەکوژن ، ڕۆژێک لەڕۆژان لەشفرۆشیان کردووە .
* 75% ی لەشفرۆشەکان هەوڵی خۆکوشتنیان داوە .
* 38% ی دەلاڵەکان هانی لەشفرۆشەکان دەدەن بۆ پۆرنۆگرافی ، واتە فیلم و وێنەی سێکسی .
* 80% ی کڕیارەکان پۆرنۆگرافیا بەکار دەکەن بۆ ئەوەی بە لەشفرۆشەکان بڵێن چیان بۆ بکەن .